مشکە

Mishke

له دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

ئاراس

دەردەچێت

مشکە بۆ تەمەنی ٩ تا ١٤ ساڵانە




خاوەنی ئیمتیاز

**بەدران ئەحمەد حەبیب**

سەرنووسیار

**ئەمیر حاجی داود**

راوێژکار

**ڕێواس ئەحمەد**

بەڕێوەبەری نووسیاری

**ڕەهێڵ ڕەشید**

سەرپەرشتیاری هونەری و نەخشەسازی

**گەیلان عەبدوڵلا**

٤٦٧٥٦٠٧

وێنەکێش

**پەروەر**

**شێروان موحسین**

دەستەی نووسیاری

**هەوار شەریف**

**داستان کاکەساڵح**

**شنە سەدیق**

**زارا ئەحمەد**

هەڵەگری

**شێرزاد فەقێ ئیسماعیل**

ژمارە ٥٠ ئایار ٢٠١٠



دەتوانن بابەتەکانتان بەم ناونیشانە بۆ ئێمە ڕەوانە بکەن

هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس ـ شەقامی گوڵان

لەرێی (بۆتان جەوهەر)ەوە بابەتەکانتان رەوانە بکەن.

سەنتەری لاوانی میدیا بۆ ڕۆشنبیری و هونەر و ڕاگەیاندن ـ گەڕەکی کوران

کەرکووك ـ دەزگای ڕۆشنبیری شەفەق

سۆران ـ دەزگای زاری کرمانجی بۆ ڕۆشنبیری و هونەر و ڕاگەیاندن

یان لەرێگای پۆستی ئەلیکترۆنی

E.mail: mshka _ mag@yahoo.com

E.mail: gaylanart@yahoo.com

# گەڕان بەشەو

نووسینی: حەمە سەعید ڕەشید
وێنە: شێروان موحسین

دوای نانی ئێوارە (وریا) ویستی بچێتە دەرەوە. دایکی بانگی لێ کرد، وتی: وریا بۆ کوێ دەچیت؟
- بۆلای هاوڕێکانم دەچم.
- بیستومە لەگەڵ زیاد و سامانە دەچن بۆ سەر چیا. کوڕم ناترسن توشی شتێك بن.
- نادایە لەو باوەڕەدانیم کە مەترسیدار بێت.

شەوێکی تاریکی بێ مانگە شەو، دەچنە دەرەوە. لەبەر تاریکی چاویان باش نابینێ، لەکاتی گەڕانەوەدا تامۆراییەك دێتە ڕێگەیان نازانن چییە! لەجێی خۆیان ڕادەوەستن دەکەونە قسەکردن و پرسیارکردن.

وریا: دێوە یا هەوری مەنگە؟
چییە بەم شەوە زەنگە
سامان: نەدێوە نە هەوری مەنگ
دڕەندەیەکە دەبەنگ
زیاد: دانیشە باخۆی بڵێ
تانوت مەدەن لە گوڵێ

تامۆرایی دێتە جواب:
مادام منتان کرد بە گوڵ
ڕێزتان لێ دەگرم بە دڵ
نهێنی دەدەم پێتان
بەس نایدرکێنم لاتان
دوو چاوم هەن دووربینە
لە بینین زۆر بەتینە
لە دەشتی چۆڵ و کپە
بەڕۆژ ماتم بێ چپە
کەم کەم هەڵوێستە دەکەم
تاشك بە ڕانێ دەکەم
حەزم لە باو بوودانە
شوان لەماڵ سەگ دالانە
نییە وەك من بەتوانا
پەز بدزێ لەناو ڕانە
ئەگەر باوەڕیش ناکەن
بپرسن لەو شوانە

ئەمجا هەرسێکیان پێکەوە دەڵێن:
چاوەڕێی جوابمان دەکەی
ئەبێ مۆڵەتمان بدەی
دەڕۆین سوبەی دێینەوە،
جوابت بۆ دێنینەوە

تامۆرایی: بەس بە شەرتێ لای کــەس باسم نەکــەن، ئەمانیش ئەڵێن بەڵێن بێت لـە نێوان خۆماندا دەرنەچێت لەسەر بەڵێنەکەی خۆیان لای کەس باسی ناکەن بەس شیعرەکە بۆ مەتەڵ زان دەگێڕنەوە دەڵێ ئەو مەتەڵە گــورگە. ئەوی دوایی هەرکەسە و سەگی خۆی رێ دەکات و دەڕۆن چاوەڕوانی دەکەن. گــورگ لە دوورەوە دەیان بینێ سەگــیان پێیە دەڵێ: ئەی ئافەرین مەتەڵەکەتان زانیوە ئیتر پێویست ناکــە بێم بۆلاتان خوا حافیز. ئەمجا سێ منداڵەکــە دەڵێن بەس نەبوو نەمانی خوارد ئیتر لەو شەوەوە دەرناچین دەریش چین بەبێ سەگ دەرناچین چونکە گورگ لە سەگ دەترسێ.



# ڕێگای قوتابخانەی کاڵێ و هاوڕێکانی

نووسینی: زارا ئەحمەد
وێنە: شێروان موحسین

لە خوارماڵی کاڵێ گیایەکی سروشتی جوان بەرز ببۆوە. نێو گیایەکە ببوو بە سەرەڕێی کاڵێ و هاوڕێیەکانی ئەو کاتانەی کە دەچوون بۆ قوتابخانە لە نێو گیایەکەدا دەڕۆیشتن و ئەوەندەیان پێ خۆش بوو دەستێکیان بە دەسکی جانتاکەی شانیانەوە بوو دەستەکەی تریان بەسەر گیایەکەدا دەخشاند. ئەوەندە بە جوانی بەدوای یەکتردا غاریان دەدا، هەموو ڕۆژێ ئەوەیان کردبوو بە پیشەی خۆیان. ڕۆژێکیان کە بۆ قوتابخانە دەچوون ڕێگای نێو گیایەکەیان گرتەبەر. لە ڕێگادا کاڵێ هاواری لێبەرز بۆوە گوتی: ئەی دایە گیان، وەی بابی خۆم. مار پێوەی دام وەی قاچم.



هاوڕێکانی بۆ لای کاڵێ رایان کرد و لە دەوری کۆبوونەوە. سیما سەیری قاچی کاڵێی کرد، دوای ئەوەی ئەو لاو ئەو لای کاڵێ گەڕا ماریان نەدی هەریەکە و لەوناوە لە مارەکە دەگەڕا، بەڵام دیسان هیچ دیار نەبوو. بینیان دڕکێك لە نێو گیایەکە بەرز بۆتەوە کە دڕکەکەیان بینی وتیان کاڵێ گیان ئەها بڕوانە ئەو دڕکە ئازاری تۆی داوە و لە قاچت راچووە مار نەبووە، مەترسە ماری لێ نییە، پێوەدانی مار ئازاری زۆرە!

ئەوانیش دڵنیا نەبوون کە لەو ڕێگایە ماری لێیە یان نا!

هەر ئەو کاتە دڕکەکەیان هەڵکێشا و فڕێیان دایە نێو گیایەکە. ئەو رۆژە خۆیان تەکاند و جانتاکەیان هەڵگرتوو بەرەو قوتابخانە رۆیشتن.

دوای ماوەیەك گیایەکە وردە وردە بەرەو زەرد بوون دەچێ و وشك دەبێ. منداڵانیش بۆ مەبەستی یاریکردن گیایەکە دەسوتێنن بۆ ئەوەی زەویەکە بکەن بە گۆڕەپانی یاری کردنیان.

دوای پشووی تاقی کردنەوەکان دەوامی قوتابخانە دەستی پێکردەوە. کاڵێ و هاوڕێکانی بە ڕێگایەکەدا رۆیشتنەوە بینیان گیایەکە سوتاوەو هەر چەندە زەویەکە فراوان بووە بەڵام خۆشی و جوانی جارانی نەماوە. لە کاتی رۆیشتنیاندا سیما وەك بڵێی شتێکی سەیری دیبێ واقی وڕما گوتی ئەی ئەوە چییە؟

کاڵێ گوتی ها چی بووە، سیما بە پەنجەکانی ئاماژەی بۆ سەر زەوییەکە کرد. کاڵێ بینی مارێك دوو پارچە کراوەو لەسەر ڕێگایەکە فڕێ دراوە. تا بەتەواوی سەیریان نەکرد بڕوایان نەدەکرد ئەوە ماری راستییە. لەو بڕوایە دانەبوون ئەو ڕێگایەی کە لە سەرەتای ساڵەوە پێیدا دەڕۆن پڕ مەترسی ببووبێ و ماری لێ بێ.

پێدەچوو ئەو رۆژەی کە منداڵەکان گیایەکەیان سوتاندووە ئەو مارەشیان کوشتبێ.

کاڵێ و هاوڕێکانی وانەیەکی باشیان وەرگرت کە بۆ هەرکارێکیان پلانی باشی بۆ دابنێن و بە وردی بیری لێبکەنەوە بۆ ئەوەی لە رووداو و مەترسی دووربکەونەوە. توشی ئازار و ناخۆشی نەبن. زۆر بەدڵنیایی بەڕێگادا بڕۆن. هەربۆیە لەو رۆژەوە ڕێگای سەر شۆستەکەیان هەڵبژارد تا لەمەودوا بیکەنە ڕێگای قوتابخانەیان و بە دڵنیایی هاتووچۆ بکەن.



ئامادەکردنی: هەوار شەریف

مشکە بۆ وەڵامەکانتان دەگەڕێ




# ژیانی مێرووەکان

ئەم فیلم کارتۆنە خۆشە بەرهەمی (واڵت دزنی) و (بیکسارە) دەربارەی ژیان و هاوڕێیەتی و هاریکاری مێرووە بچوکەکانە. ئەو کاتەی شارە مێللورە سپییەکان لەلایەن کوللەکانەوە پەلاماردەدرێن و هەموو ساڵێك رەنج و ماندووی مێرووە بچوکەکان دەدزن، مێرووەکان بێزار دەبن و دەیانەوێت بەدوای یارمەتیدا بگەڕێن و مێروویەکی لەخۆیان بەهێزتر یارمەتیان بدات بۆ ئەو کارەش (فیلیك) کە مێرووەیەکی سپییە دەینێرن بۆ ئەو کارە، بەڵام (فیلیك) بێهیوا دەبێت و لەرێگا بە مێرووە بچوکەکان کەلە سیرکی نێو دنیای بونەوەرەکان کاردەکەن، کە جاڵجاڵۆکە و خاڵخاڵۆکە و قالۆنچە و کرمە سەوز و مێشولەکان، (فیلیك) دەیانهێنێت بۆ شارە مێروولەکان، بیرلەوە دەکەنەوە کە کوللەکان لە باڵندە دەترسن بۆیە باڵندەیەکی دەست کرد دروست دەکەن، بەڵام بۆ شای مێروولەکان دەردەکەوێت کە ئەوان درۆیان کردووەو نازانین بەهۆی ئەو درۆیەوە لەگەڵ فیلیك لەشارە مێروولەکان دەردەکرێنو کوللەکان پەلاماری شارە مێللورەکە دەدەن و فیلیك و هاوڕێکانیدەگەڕێنەوە بۆ شارە مێروولەکە و یارمەتی مێروولەکانی تر دەدەن کە ژمارەی زۆر زیاترە لە کوللەکان.

کوللەکان راودەنێن و دەزانن گەر هاریکاری یەکتر بن دەتوانن شارەکەیان رزگار بکەن و بەوبۆنەیەوە ئاهەنگێکی گەورە سازدەکەن.



# گەڕان بەدوای نیمۆ

کۆمپانیای واڵت دزنی وەك گەورەترین کۆمپانیای (فیلم کارتۆن) هەردەم لە دروست کردنی فیلمی جوان و نایابە بۆ منداڵان، ئەم جارە لەم فیلمەدا دەچێتە ژێر دەریا و فیلم کارتۆنێکی زۆر زۆر خۆش دروست دەکات بەناوی (گەڕان بەدوای نیمۆ) کەباس لە ماسیەکی بچوك دەکات کە هەردەم لەگەڵ باوکیدایە و ناوی (مارلینە)، نیمۆ بەگوێی باوکی ناکات و لەباوکی دووردەکەوێتەوەو لەناکاو راوگرێك لەگەڵ کۆمەڵێك ماسیدا راوی دەکات و دەیخاتە نێو حەوزی ماسییەکان، ئیتر باوکی نیمۆ ئەرکی ئەوە دەبێت بەدوای نیمۆدا بگەڕێت. (نیمۆی) بەسسزمانیش لەنێو حەوزی ماسیەکەدایەو بیری باوکی دەکات، (مارلین) لەو گەشتەی بۆ گەڕان بەدوای نیمۆدا دەبێتە هاوڕێی ماسیەکی بچکۆلەی شین و پێکەوە گەڕانەکەیان دەست پێدەکات. کە دووچاری رووداوی ناخۆش و ترسناك دەبنەوە هەر لەهاتنی ماسیە دڕندەکان و هاوڕێیەتی کیسەڵ و بینینی دەریا بەرینەکان دواجار (نیمۆ) دەدۆزێتەوەو دەگەڕێنەوە بۆنێو دەریاکەو ماڵە خۆشەکەی خۆیان.



# Alice in the wonderland

**ئامادەكردنی : فریا فارس**

فیلمێکـــی پڕ ڕووداوی خەیاڵی ساڵی ٢٠١٠یەو کـــە لەلایەن (لیندا ویلفیرتۆن) نوسـراوەتەوەو لە لایەن دەرهێنەر (تیم بۆرتۆن) بەرهـەم هێنراوە. لـــە پاڵــەوانیەتی (میە واســی کــۆسـە) و (جـۆن دیپ) و (هێلینە یۆهـان) و (ئانی هازوەی) و (میشایل شین) و (ستیڤان فرای) و (کراسپن گلۆرە)ە.
بابەتی ئەم فیلمە باسی کچێکی نۆزدە ساڵی دەکات بە ناوی (ئەلیس) کە بەرووداوێك (بەهەڵە) دەگەڕێتەوە جیهانی ژێرەوە کە لەلایەن ئەلیس بە هەڵە بیستراو بوو، بە ناوی جیهانی سەیروسەمەرەکان کـــە شوێنێك بوو ئەلیس سێنزە ساڵ بەر لە ئێستا سەردانی کردبوو. ئەلیس وای پێ وترابوو کە ئەو تاکە کەسە دەتوانی (جابیرۆکی) بکوژێت.
ئەم فیلمە تەکنیکێك بکاردێنێت کـــە جوڵەی ڕاستەقینە و جوڵەی دروست کــراو پێکەوە دەبەستێتەوە لە هەمان کاتتدا.





بۆرتۆن باس لە چیرۆکە ئۆرجینالەکەی جیهانی سەیروسەمەرەکان دەکات دەڵێت بەردەوام دەربارەی کچێك بوو لە دەوروبەر دەگەڕا لە ئەکتەرێکی سەیرەوە بۆ ئەکتەرێکی ئاسایی. بەڵام بۆرتۆن هەستی بەهیچ پەیوەندیەکی سۆزداری نەکرد بۆیە ویستی فیلمەکە هەستی پێ بکرێت زیاتر وەك چیرۆکێك هەیتی پێ بکرێت نەك وەك زنجیرە رووداوێك. بۆرتۆن ئەم فیلمە بەتەواوکەر و دووبارە خەیاڵ کراوەی فیلمەکەی پێشوو دانابێت.

## یەکەم نمایش کردنی فیلمی جیهانی سەیروسەمەرەکان

ئەم فیلمە لە لەندەن لە ( odean leicestes ) لـــە ٢٥ی فبرایەری ٢٠١٠ نمایش کـــرا وەهەروەهـا لـــە ئوسـتراليا لە ٤ی مارسی ٢٠١٠ بڵاوکرایەوە لە ئەمریکا و بەریتانیا.

لە ٥ی مارسی ٢٠١٠ لە لایەن ( disiny digital 3d,i max 3d )وە شانۆیە نۆرماڵەکان نمایش کرا.




## بودجەی فیلمەکە

بودجەی ئەم فیلمە دوو سەد ملیۆن دۆلارە هەروەها دەست کەوتی ئەم فیلمە ( ٥٨٠,٥٧٧,٠٠٠) دۆلار بوو.

## بیرۆکەی فیلمەکە

ئـەم فیلمە بە فەرمـی دانرابوو لـە سـاڵی ٢٠٠٩ بڵاوبکـرێتەوە بەڵام دواخرا بۆ ٥ی مارسی ٢٠١٠ وێنەگـرتنە سەرەکـییەکـان دارێژرابوو لە ٢٠٠٨ بەڵام دەستی پێنەکـرد تا دیسەمبەری هەمان ساڵ وە لەماوەی سێ مانگ تەواو کرا.

کۆمپانیای (sony picture image work) کاریگەرە بینایەکانی ئەم فیلمەی دیزاین کرد.



بۆرتۆن هەستی کرد کە کامیرای سێ ڕەهەندی گونجاوە بۆ ژینگەی ئەم فیلمە بەڵام بۆرتۆن و زانووك بڕیاریاندا بەکامێرای ئاسایی فیلمەکە دەربهێنن وە بیگۆڕن بۆ کامێرای سێ ڕەهەندی دوای دەرهێنان.
ئەوان وا هەستیان کرد هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوان وێنەی گۆڕاو کە بە کامێرای ئاسایی بگیرێت و وە دوایی بگۆڕێت بۆ کامێرای سێ ڕەهەندی.
جیمس کامیرۆن کە لە فیلمی ئاڤاتاری سێ ڕەهەندی کە لە دیسەمبەری ٢٠٠٩ بڵاوکردەوە ڕەخنەی لە هەڵبژاردنەکانی بۆرتۆن و زانووك گرت بە خستنە ڕووی ئەوەی کە بێ مانایە بە کامیرای ئاسایی وێنەی بگیرێت و دوایی بگۆڕێت بۆ کامێرای سێ ڕەهەندی.




پاڵەوانییەتی جامی جیهانی ٢٠١٠ نۆزدەهەمین پاڵەوانییەتی جیهانە کــە لە ماوەی ١١/٦تاوەکو ١١/٧/٢٠١٠لــە وڵاتی باشوری ئەفریقیا کە بۆ یەکەم جارە ئەم پاڵەوانییەتییە ئەنجام دەدرێت.

یارییەکانی ئەم پاڵەوانییەتە لە دە یاریگە لە نۆ پارێزگە ئەنجام دەدرێت.تیپەکانی بەشداربوو ٣٢تیپە کــە بەم شێوەیە دابەش کراوە:

- وڵاتانی ئاسیا چوار وڵات.
- وڵاتانی ئەفریقیا شەش وڵات.
- وڵاتانی ئەمریکای باکور سێ وڵات.
- وڵاتانی ئەوروپا سێزدە وڵات.
- وڵاتانی ئەمریکای باشور پێنج وڵات.
- وڵاتی نیوزلەندا.




## گروپەکان بەم شێوەیە :

| کۆمەڵەی یەکەم | کۆمەڵەی دووەم | کۆمەڵەی سێیەم | کۆمەڵەی چوارەم |
|---|---|---|---|
| باشوری ئەفریقیا | ئەرجەنتین | ئینگلترا | ئەڵمانیا |
| مەکسیک | نێجیریا | ئەمریکا | ئوستراليا |
| ئۆرگوای | کۆریای باشور | جەزائیر | سربیا |
| فەرەنسا | یۆنان | سلۆڤینیا | گانا |

| کۆمەڵەی پێنجەم | کۆمەڵەی شەشەم | کۆمەڵەی حەوتەم | کۆمەڵەی هەشتەم |
|---|---|---|---|
| هۆڵەندا | ئیتالیا | بەرازیل | ئیسپانیا |
| دانیمارک | بارگوای | کۆریای باکور | سویسرا |
| یابان | نیوزلەندا | کۆدیڤوار | هندوراس |
| کامیرۆن | سلوفاکیا | پورتوگال | تشیلی |

یەکەم یاری مۆندیالی ٢٠١٠ ڕۆژی هەینی لە نێوان هەردوو هەڵبژاردەی مەکسیك و باسوری ئەفریقیایە. هەروەها فەرەنسا و بارگوای.

یەکێتی تۆپی پێی جیهانی بۆ ئەمساڵ نزیکـــەی چوار سەد و بیست ملیۆن دۆلاری ئەمریکـــی ئامادەکـــردووە زیاتر لە ٦٠% لە مۆندیالی پێشووی ٢٠٠٦ لە ئەڵمانیا هەر هەڵبژاردەیەك نزیکەی یەك ملیۆن دۆلار وەردەگـــرێت بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەم پاڵەوانییەتییە، پاشان پارەکە بەم شێوەیە دابەش دەبێت:

| قۆناغ | بڕی پارە بە دۆلاری ئەمریکی |
|---|---|
| قۆناغی کۆمەڵەکان | هەشت ملیۆن |
| قۆناغی شازدە | نۆ ملیۆن |
| قۆناغی هەشت | هەژدە ملیۆن |
| چوار گۆشەی زێرین | بیست ملیۆن |
| تیپی کۆتایی | بیست و چوار ملیۆن |
| پاڵەوان | سی ملیۆن |
| کۆی گشتی | چوار سەد و بیست ملیۆن |

# هاوڕێیانی مشکە

**ئامادەکردنی: ساکار شەریف**

ئەم کاتەتان باش هاوڕێکانم!
هاوڕێکانم ئەم جارە بۆ سەردانی هاوڕێکـانم چومە خانەی میوزیکی منداڵان لە شاری سلێمانی و هەروەها فیستیڤاڵێکی گۆرانی.
مۆسیقای زۆر خۆشیان سازکردبوو، منداڵەکـانی ئەوێ زۆر بەهرەمەند و مۆسیقایان زۆر خۆش دەوێت کە هاوکات لەخوێندندا زیرەکن و وانەکانیان فەرامۆش ناکەن.
لەوێ منداڵێکی بەهرەمەندم بینی کە مۆسیقای زۆ خۆشدەوێت و بووە هاوڕێم و حەزیشم کـرد ئێوەی منداڵانیش ئەو هاوڕێیە بناسن.
ناوی (محەمەد ناسرە) و لـە پۆلی شەشەمەو حەزی لـە مۆسیقا و وێنەکـێشانە و هەروەها یاری تۆپ تۆپێنیش دەکات. یاریکەر (میسی) خۆشدەوێت کە گۆڵی جوان جوان دەکات.
(محەمەد) سەیری ئەفلام کارتۆن دەکات بەتایبەت (تۆم و جیری) جیری زۆر خۆش دەوێت چونکە ئازا و وریایەو زوو زوو تۆم هەڵدەخەڵەتێنێ.
بەڵام کاتی دیاری کراو بۆ ئەو چالاکیانەی دادەنێت و خوێندن و وانەکـانی فەرامۆش ناکـات هەرکاتێك لە وانەکانی تەواو بوو ئەو کـات وێنە و راهێنانی مۆسیقا و سەیری فیلم کـارتۆن دەکات.



محەمەد چوار خوشك و پێنج برای هەیە و دایکیشی زۆر زۆر خۆشدەوێت، هەروەها زۆر کـەم خەون دەبینێ کە خەونیش دەبینێ براکەی دێتە خەوی کە لە ئەوروپایە و لێی دوورە.
محەمەد پارە زۆر کـەم خەرج دەکـات و زرۆیش حەزی لەنەستەلە خواردنە.

ئای چەند خۆشە نەستەلە بەڵام دەبێت ئاگاداری ددانەکانمان بین. هەروەها حەز دەکات کە گەورە بوو، ببێت بە پزیشك. منداڵە ئازیزەکان وەکو پێم گوتن ئەم هاوڕێیەمان مۆسیقای زۆر خۆشدەوێت و حەزی لە ئامێری کەمانچەیە و سەردانی خانەی میوزیك دەکات تاوەکو بەشداری خولی مۆسیقا بکـات. ئاواتە خوازە ئامێر ژەنێکی سەرکەوتوو بێت و هەروەها لە ماڵیشەوە دوای وانەکـانی راهێنان دەکات و (دیدار)ی هاوڕێی و منداڵانی زۆر خۆشدەوێت.

ئافەرین بۆ ئەم هاوڕێیەمان و هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازین.



# مێروولەی باڵدار

نووسینی: مەرسوم گەشبین

وێنە: شێروان موحسین



منداڵەکان بەهار هات
وا مێروولەی باڵدار هات
ڕۆژێکی خۆرە تاوە
بەهار خێمەی هەڵداوە
چەمەن و دەشت و دەوەن
سەر لوتکە و کێو و دەربەن
بەگیا داپۆشراوە
سروشتە ڕەنگی کراوە
بۆنی گەلی ڕەنگا و ڕەنگ
لەگەڵ ئاسمانی قەشەنگ
زستان بەفری تواوە
کەرەسە و باری پێچاوە
لەشار و لە دەشت و شاخ
لە کێو و هەرد و لە باخ
ئامادەیە وا دەڕوا



ساڵی تر پەتایە خوا
دێیەوە بۆ نیشتیمان
بۆ دۆڵ و دەشت و کوێستان
دەهێنێ بەفر و باران
دەبارێ بەسەر شاران
تێر تێر ئاو دەکا زەوی
بە هەوری بەرز و نەوی
بە گرمەی دەگرمێنێ
شار و دێ دەلەرزێنێ
چەخماخەی دەوەشێنێ
باران لەگەڵ خۆی دێنێ
رووبار چست و گوڕ دەکات
ئاوی خوڕە خوڕ دەکات
جیهان نوێ دەکاتەوە
بە ئەرز گیان دەداتەوە



# سەردانی مشکە و دمبۆ بۆ نەرویژ

ئامادەکردنی: ڕێواس ئەحمەد

دمبۆ هەرگیز ماندوو نابێت، ئەو ناتوانێ لەیەك وڵاتدا نیشتەجێ بێت. بەردەوام لە گەشتی وڵاتاندایە. لەگەڵ خۆیدا مشکەش پەلکێشی ئەو وڵاتانە دەکات. هەموو جارێ مشکە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، خێرا دمبۆ پەشیمانی دەکاتەوە. ئەمجارەیان پێکەوە چوون بۆ نەرویژ. مشکەش خێرا ئەم نامەیەی بۆ هاوڕێیانی نووسی:

هاوڕێیانم!

هیوادارم هەمووتان باش بن و لە قوتابخانە سەرکەوتوو بن. من ئێستا لە ئۆسلۆی پایتەختی نەرویژم.

ئەم شارە هەر زۆر خۆشە، زۆر پاکە، دار و سەوزایی زۆری لێیە.

ئەمە جگە لەو باخچانەی کە پڕە لە گوڵی هەمەڕەنگ. چوومە چەند قوتابخانەیەك، قوتابخانەکان زۆر گەورەن، لە هەر پۆلێکدا لە بیست تا بیست و پێنج قوتابی تێدایە.

پۆلەکانیان زۆر گەورەن، ئەمە جگە لەو هەموو کەرەستە هەمە جۆرەی فێربوون کە لەبەردەست قوتابییاندا هەبوو. خێرا بیرم لە ئێوە کردەوە.

نەرویژ وڵاتێکی دەوڵەمەندە، سامانی سروشتی زۆرە وەك نەوت و دارستان و ئاوی زۆرە کە بەهۆیەوە کارەبای هەموو وڵاتەکە دابین دەکەن. هەروا دەکەوێتە سەر دەریا بۆیە ماسیش سەرچاوەیەکی گرنگی ئەم وڵاتەیە.

نەرویژ لە پاش ساڵانی هەفتاکانەوە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر پێشکەوتووە. سامانی نەتەوەیی بەشێوەیەکی زۆر دروست بەکاردەهێنێ بۆ ئاسوودەیی و بەختەوەری گەلەکەی.

سروشتی ئەو وڵاتە یەکجار جوانە، گەلێ چیای بەرز و دۆڵ و دەشتایی سەوزی لێیە.

بەرزترین چیای ناوی (گالدهۆپیگانە) و بەرزاییەکەی ٢٤٦٩مەترە. ئاووهەواکەی لە زستاندا زۆر ساردە و بەفرێکی زۆر دەبارێ.



له مانگی پێنجەوە تا مانگی حەوت هەتاو لە زۆربەی ناوچەکـانی ئەم وڵاتە بە تەواوەتی ئاوا نابێت، لەهەندێ شوێنی تری بەدرێژایی بیست کاتژمێر ئاوا نابێت. بەڵام بەداخەوە بە زستان واتە لە مانگی یانزەوە تـا مانگـی یەك لە باکـوری ئـەم وڵاتە هەتاو هەڵنایە، لـەبەشی باشووریدا تەنیا چەند کاتژمێرێکی کەم هەتاو هەڵدێت.

ئەم وڵاتە لەگـەڵ ئەوەی پەرلـەمان بەڕێوەی دەبات بەڵام هێشتا سیستەمی پادشـایەتی تێدا ماوە، هەرچەندە پادشـا دەستەڵاتی سیاسی نییە ئەو پەرلەمانەی کـەلە ١٦٩ ئەندام پێکهاتووەو هەر چوار ساڵ جارێ هەڵدەبژێری بەڕێوەی دەبات.

دانیشتوانی ئەم وڵاتە ٤٧٣٧١٧١ هاووڵاتییە و زمانەکـەیان پێیدەوترێ نەرویژی و ئـاینی مەسیحیش ئاینی سەرەکییە.



# کتێبخانەی مشکە

لە کتێبخانەی مشکە هەر جارە و باسی کتێبێکتان بۆ دەکەین، بۆ ئەوەی ئێوەش بتوانن، ئەو کتێبەتان دەست بکەوێت و بیخوێننەوە.

منداڵە خۆشەویستەکان ئەمجارە کتێبخانەی مشکە کتێبێکی بۆ ئامادە کردوون بەناوی (خەونەکەی دارا).
ئەم کتێبە چیرۆکی منداڵانەو (موکەڕەم رەشید) وەریگێڕاوە.
چیرۆکەکەش باس لە منداڵێك دەکات ناوی دارایە وەك منداڵەکانی دیکە خەون و ئاواتی خۆی هەیە، بەڵام بە لای ئەوەوە ژیان گەشتێکی خۆشە، بە یاری و رابواردن بەسەری دەبات، بە لایەوە گرنگ نییە سەرکەوێت یان شکست بێنێت، گرنگ ئەوەیە ئاسوودەو کامەران بێت. جا خۆشەویستانم من لێرەوە بۆ ئێوەی خۆشەویست جێدەهێڵم خۆتان بیخوێننەوە و بزانن چی روو دەدات.




ناوی کتێب: **خەونەکەی دارا**
وەرگێرانی: **موکەڕەم رەشید**
وێنە: **ئاڤان سەرسام**
بابەت: **چیرۆکی منداڵان**



# گەلەریی مشکە







نسار جەعفەر
پۆلی چوارەمی سەرەتایی
قوتابخانەی شانەدەری تێکەڵاو





دەلال زیوەر
پۆلی سێیەمی سەرەتایی
قوتابخانەی خاپوری تێکەڵاو





نیگار جەعفەر
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
قوتابخانەی شانەدەری تێکەڵاو





هانا هادی
پۆلی پێنجەمی سەرەتایی
قوتابخانەی لیزای تایبەت

# پشووی مشکە

مندالآنی ئازیز وەرن با بەیەکەوە ئەم وێنەیە بە چەند قۆناغێك دروست بکەین و لەپاشان بەو شێوەی کە ئامادە کراوە رەنگی بکەین.



1



2



3



4


میوانانی مشکە
سان سەرهەد
شاد سەرهەد
پەنا ئازاد
سارا جەلال
محەمەد ئەمیر
شاد کامەران
پەنا ئاراس
ئەلەند جەلال
ئالیا جەلال
ئارا جەلال
لیا هێمن

# پۆستی مشکە

سڵاو بۆ خوێنەرانی مشکە
کە خاڵم لە کوردستان هاتەوە، چەند ژمارەیەکی مشکەی بۆ هێنابووم. هەندێ بابەتم خوێندەوە.
هەندێکیان کوردییەکەی بۆ من گران بوو. حەزیشم کرد ئەم نامەیەتان بە یارمەتی دایکم بۆ بنووسم.
من ناوم سارایە و تەمەنم دوانزە ساڵە، لە شاری مالمۆی دەژیم. لەگەڵ دایکم و دوو برامدا دەژین.
براکانم لەخۆم گەورەترن. من زۆر حەزم لە یاری فتبۆڵێنە.
لە هەفتەیەکدا سێ جار راهێنانمان هەیە و یاری دەکەین. ئێمە پانزە کچین لە تەمەنی دە ساڵەوە تا دوانزە ساڵ ئەندامی ئەو تیپەین. من ساڵێکی تر دەچمە تیپێکی ترەوە.
ئێمە هەموو زۆر حەزمان لە تۆپێنە. پێش ماوەیەك لە قوتابخانە راپۆرتێکم لەسەر فتبۆڵێن نووسی، بەپێی بۆچوونی ئەرکۆلۆگەکان چین یەکەمین وڵات بووە لە ی٣٠٠ پێش زایین تۆپییان دروستکردووە هەروەك ئێستا دوو تیپیان دروستکردووەو گۆڵییان هەبووە.
تۆپەکەش لە پێست دروستکراوەو پەرییان خستووەتە ناوەکەی.
جگە لە تۆپێن زۆر حەزم لە خوێندنەوەی رۆمانی گەنجان و سەیرکردنی فیلمە. حەزدەکەم گۆڤارەکەتان زیاتر شت بۆ تەمەنی ئێمە بنووسێ و بگاتە ئەوروپا.

